# Marcel and The Mona Lisa

منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

# مارسل و مۆناليزا

ئنگلیزی - کوردی



وەرگێڕانی:
دکتۆر ماکوك محمد قەرەداخی

پرۆژەی خۆڕاهێنان لەسەر زمانی ئنگلیزی

ئاستی یەکەم :

دەسپێکەران

# Marcel
## and The
# Mona Liza

# مارسڵ و مۆنا لیزا

**Stephen Rabley**

وەرگێڕانی :

**د.ماكۆك محمد قەرەداخی**

dr.makok@hotmail.com

چاپی یەکەم

2005

ژمارەی سپاردن ( 738)ی ساڵی 2005



Marcel is a French mouse, and a detective. He has lots of friends in Paris. One of them is Celine. She paints pictures and is very beautiful. Celine's home is at the Louvre. Marcel often goes there for dinner.

مارسڵ مشكێكی فەرەنسییە، وە پۆلیسی پشكنێنەریشە. ژمارەیەك هاوڕێی هەیە لە پاریس. یەكێك لەوانە سیلێنە. سیلێن وێنە دەكێشێت وە زۆر جوانە.ماڵی سیلێن لە (لوّڤەر)ە. زۆرجار مارسڵ بۆ نانی ئێوارە دەچێت بۆ ئەوێ.

One evening in May he arrives with some pink flowers. There is a guard at the door. ***"I don't know him,"*** Marcel thinks. ***"He must be new."*** Then he walks inside.

ئێوارەیەكی مانگی مایس بە هەندێك گوڵی پەمەییەوە دەگاتە ئەوێ. پاسەوانێك لە دەرگاكەدایە. مارسڵ بیردەكاتەوە "من نایناسم، لەوانەیە تازە بێت." پاشان دەڕواتە ناوەوە.



The two friends eat, drink and talk all evening. Celine shows Marcel her new paintings. They talk about their summer holiday in Los Angeles. They laugh, play jazz records and tell lots of stories.

هەموو ئێوارە دوو هاورێکە دەخۆن و دەخۆنەوە و قسەدەکەن. سیلین تابلۆ تازەکانی پیشانی مارسڵ دەدات. دەربارەی پشووی هاوینەیان لە (لۆس ئەنجلس) قسەدەکەن. پێ دەکەنن، قەوانی مۆسیقای جاز لێ دەدەن، و ژمارەیەك چیرۆك دەگێڕنەوە.

Then at 11 o'clock Marcel puts on his coat. ***"It's late,"*** he says. ***"I must go home."*** Two minutes later he leaves. ***"Good night,"*** says Celine. Then she closes her front door.

پاشان کاتژمێر 11ی تەواو مارسڵ پاڵتۆکەی لەبەر دەکات، دەڵێ:"درەنگە، پێویستە بڕۆمەوە ماڵ." دوو خولەك دواتر دەڕوات. سیلین دەڵێ:"شەو شاد." پاشان دەرگای پێشەوە دادەخات.



Marcel walks across the floor. He is very happy. Then he stops. The room is dark, but he can see something. What is it? A man? A man with a long knife?

مارسڵ بەسەر زەوییەکەدا دەڕوات، زۆر دڵخۆشە. پاشان دەوەستێت، ژوورەکە تاریکە، بەڵام دەتوانێت شتێك ببینێت: چیيە؟ پیاوێك؟ پیاوێك بە چەقۆیەکی درێژەوە؟

Yes! Suddenly Marcel's mouth is very dry. He runs to the wall. Then, after five seconds he looks again. This time he can see the man's face. ***"It's that new guard,"*** he thinks. ***"And he's ... he's stealing the Mona Lisa!"***

بەڵێ، کتوپڕ دەمی مارسڵ ووشك دەبێت. ڕادەکات بۆلای دیوارەکە. پاشان پاش پێنج چرکەی تر سەیر دەکاتەوە. ئەم جارە دەتوانێت ڕووخساری پیاوەکە ببینێت. بیردەکاتەوە "ئەوە پاسەوانە تازەکەیە، وە ئەو ... ئەو مۆنا لیزا دەدزێت !"



Next to the thief there is a black bag. Two minutes later the Mona Lisa is inside it. The thief smiles and picks up the bag. But a second later he puts it down again. ***"Car keys,"*** he says, and begins to look in all his pockets. ***"All right, this is it,"***

له تەنیشت دزەکەوە جانتایەکی ڕەش هەیە. دوو خولەك دواتر مۆنا لیزا لە ناویدایە. دزەکە زەردەخەنە دەیگرێت و جانتاکە هەڵدەگرێت. بەڵام ساتێك دواتر دایدەنێتەوە، دەڵێ:"کلیلەکانی ئۆتۆمبیلەکە،" وە دەست دەکات بە سەیرکردنی هەموو گیرفاناکانی :"باشە، ئەمەتا."

Marcel thinks. ***"It's now or never."*** He runs along the wall very fast, climbs up the tall, black bag, and jumps inside it.

مارسڵ بیردەکاتەوە "یان ئێستا یان هەرگیز" زۆر بە خێرایی بە درێژایی دیوارەکە دەڕوات. بەسەر جانتا درێژە ڕەشەکەدا هەڵدەگەڕێتە سەرەوە و باز دەداتە ناوی.



At the bottom of the bag Marcel can see a face. The Mona Lisa's face. She is smiling at him. ***"Now what?"*** he asks her. There is no answer, but at that moment the bag starts to move.

**لە بنکی جانتاکە مارسڵ دەتوانێت دەم و چاوێك ببینێت، دەم و چاوی مۆنا لیزا. مۆنا لیزا زەردەخەنەی بۆ دەکات، مارسڵ لێی دەپرسێت: "ئێستا چی؟" هیچ وەڵام نییە. بەڵام لەو ساتەدا جانتاکە دەست دەکات بە جوڵان.**

Marcel can hear lots of noises: a motor starts- traffic goes by- a radio plays. Then the bag suddenly stops. Marcel climbs the painting and looks out. ***"A railway station!"***

**مارسڵ دەتوانێت گوێی لە ژمارەیەك دەنگەدەنگ بێت: ئۆتۆمبیل دەست دەکات بە ڕۆیشتن، ترافیك لایت دەکەوێتە جموجوڵ، ڕادیۆ دەکەوێتە ئیش. پاشان جانتاکە لەپڕ دەوەستێت. مارسڵ بەسەر تابلۆکەدا سەردەکەوێت و تەماشای دەرەوە دەکات "وێستگەی شەمەندەفەر !"**



Five minutes later the Louvre 'guard' gets on a train. He sits next to a thin man in sunglasses and a white jacket. ***"Have you got it, Antoine?"*** the thin man asks. ***"Yes,"*** the guard answers.

پێنج خولەك دواتر پاسەوانەكەی لۆڤەر سواری شەمەندەفەرێك دەبێت. لە تەنیشت پیاوێكی لاواز كە چاویلكەیەكی هەتاوی لە چاودایە و چاكەتێكی سپی لەبەردایە دادەنیشێت. پیاوە لاوازەكە دەپرسێت: "ئەنتۆین، دەستت كەوت؟" پاسەوانەكە دەڵێ: "بەڵێ."

After that the train starts and there is a lot of noise. ***"Oh no! Now I can't hear them,"*** Marcel thinks. But he can hear one or two words. ***"Italy"***, for example, and ***"all those cats"***.

دوای ئەوە شەمەندەفەرەكە دەكەوێتە ئیش، دەنگەدەنگێكی زۆر هەیە. مارسڵ بیردەكاتەوە "ئۆو، نا، ئێستا ناتوانم گوێم لێیان بێت." بەڵام دەتوانێت گوێی لە یەك دوو ووشە بێت: وەكو "ئیتالیا" و "هەموو ئەو پشیلانە."



***"Cats!"*** Marcel looks at the Mona Lisa. His eyes are two big saucers. ***"But cats kill mice,"*** he thinks. ***"They eat them. And where are we going in Italy? Rome? Milan? Naples? ..."***

مارسڵ تەماشای مۆنا لیزا دەکات: "پشیلەکان ا" چاوەکانی وەکو دوو ژێرپیاڵەی گەورەن (ئەبڵەق دەبێت)، بیردەکاتەوە "بەڵام پشیلەکان مشك دەکوژن،" "دەیان خۆن" وە لە ئیتالیا ئێمە ڕوو لە کوێ بکەین؟ ڕۆما؟ میلان؟ ناپلس؟ ..."

But at that moment Antoine puts the bag under the seat. ***"Now I really can't hear,"*** Marcel thinks. Then he goes to sleep and has a very bad dream.

بەڵام لەو کاتەدا ئەنتۆین جانتاکە دەخاتە ژێر کورسییەکە. مارسڵ بیردەکاتەوە "ئێستا بەڕاستی ناتوانم ببیستم." پاشان دەچێت بۆ نوستن و خەوێکی زۆر ناخۆش دەبینێت.



Next morning the sun is shining. Marcel opens his eyes and sees the Mona Lisa. Then he remembers where he is. He runs up the painting and looks at the Antoine and Henri. ***"Good,"*** he thinks. ***"They're asleep."***

بەیانی دواتر ڕۆژ هەڵدێت. مارسڵ چاوەکانی دەکاتەوە و مۆنا لیزا دەبینێت. پاشان بیری دەکەوێتەوە کە لە کوێیە. بەسەر تابلۆکەدا ڕادەکاتە سەرەوە و تەماشای ئەنتۆین و هێنری دەکات، بیردەکاتەوە "باشە، ئەوان نوستوون."

Ten seconds later, Marcel is standing at the window. He can see a small village and some mountains. Then a sign goes by: **a hundred and eighty kilometres to Venice!**

دە خولەك دواتر مارسڵ لە پەنجەرەکەدا ڕادەوەستێت. دەتوانێت گوندێکی بچوك و هەندێك شاخ ببینێت. پاشان نیشانەیەك بەلایدا ڕەتدەبێت:"180کیلۆمەتر بۆ ڤینیسیا !"



Two hours later, Antoine and Henri are on a gondola. ***"Look,"*** says Antoine and laughs. He shows Henri a newspaper story. It says, ***'THIEVES TAKE DA VINCI PAINTING'.***

**دوو کاتـژمێر دواتـر ئـەنتۆین و هێنـری لەسـەر گۆندۆلایـەکن*. ئـەنتۆین پێدەکـەنێت و دەڵـێ:"تەماشـاکە." سـەردێڕی ڕۆژنامەیـەك پیـشانی هێنـری دەدات، تێیدا دەڵێ:"دزەکان تابلۆی دا ڤنیسی دەبەن"**

Henri says, ***"Be quiet!"*** and turns to the boatman. ***"Do you see that big palace on the left?" "Signor Spandini's house?" "Yes. Stop there."***
Inside the bag Marcel hears every word.

**هێنـری دەڵـێ:"بـێ دەنـگ بـە !" وە لادەکاتـەوە بـۆلای بەلەمەوانەکـە:"ئـەو کۆشـکە گەورەیـە دەبینیـت لـەلای چـەپ؟" بەلەمەوانەکـە: "مـاڵی سـیگنۆر سـپاندینی؟" هێنـری: "بـەڵێ، لـەوێ ڕاوەسـتە." لـەناو جانتاکـەدا مارسـڵ گوێی لە هەموو ووتەکان دەبێت.**

*** (بەلەمێکە دوو کۆتایی بەرزی تیژی هەیە، لە ڤینیسیا بەکاردێت)**



An old woman answers the front door. ***"Come in,"*** she says to the two thieves. ***"Signor Spandini is waiting for you."*** She takes them to a big, dark room. A fat man is sitting behind a desk. ***"Have you got it?"*** he asks.

پیره ژنێك له دەرگای پێشەوە وەڵام دەداتەوە، به دوو دزەکه دەڵێ:"وەرنه ژوور، سیگنۆر سپاندینی چاوەڕێی ئێوەیه." دەیانبات بۆ ژوورێکی گەورەی تاریك. پیاوێکی قەڵەو له پشت مێزێکەوە دادەنیشێت، دەپرسێت: "دەستتان کەوت؟"

***"Yes, Boss,"*** Henri answers. The bag is beside him. ***"I can't stay in here,"*** Marcel thinks. He jumps out of the bag and hides behind a chair.

هێنری وەڵام دەداتەوە: "بەڵێ گەورەم" جانتاکه له تەنیشتییەوەتی. مارسڵ بیردەکاتەوە "من ناتوانم لێرەدا بمێنمەوە." بازدەداته دەرەوەی جانتاکه و لەپشت کورسییەکەوە خۆی دەشارێتەوە.



***"Good,"*** he thinks. ***"Now I can ..."*** But then he goes cold. ***"Cat!"*** There are seven, eight- no nine of them in the room. Suddenly Marcel remembers Henri's words- ***"all those cats."*** Then he remembers his dream on the train.

**مارسڵ بیردەکاتەوە "باشە، ئێستا دەتوانم ..." بەڵام پاشان سارد دەبێتەوە، "پشیلەکان" حەوت، هەشت، نا نۆ دانەیان لە ژوورەکەدایە. کتوپڕ مارسڵ ووشەکانی هێنری بیردەکەوێتەوە:"هەموو ئەو پشیلانە". پاشان خەونەکەی سەر شەمەندەفەرەکەی بیردەکەوێتەوە.**

What can he do? Where can he go? But it is too late. One of the cats sees him. ***"Help!"*** Marcel thinks and climbs up a red curtain.

**دەتوانێت چی بکات؟ دەتوانێت بۆ کوێ بچێت؟ بەڵام زۆر درەنگە، یەکێك لە پشیلەکان دەیبینێت. مارسڵ بیردەکاتەوە و سەردەکەوێت بەسەر پەردەیەکی سووردا "یارمەتیم بدەن."**



A moment later the cat starts climbing, too. Marcel can hear it below him. He has to do something- and fast! But what? Then he sees two candles above his head. ***"That's the answer,"*** he thinks. He jumps onto the bookcase and starts to push the candles over. They are very heavy, but in the end he does it. Below him he hears, ***"Yeeooowwwww!"***

چرکەیەك دواتر پشیلەکەش دەست دەکات بە سەرکەوتن. مارسێل دەتوانێت گوێی لێبێت لە ژێرییەوە. پێویستە شتێك بکات، وە بە خێرایی! بەلام چی؟ پاشان دوو مۆم لە ژوورسەرییەوە دەبینێت. بیردەکاتەوە "ئەوە وەلامەکەیە،" بازدەداتە سەر کتێبخانەکە و دەست دەکات بە پالپێوەنانی مۆمەکان بەسەریدا، زۆر قورسن. بەلام لەکۆتاییدا ئەوە دەکات. لەژێرییەوە گوێی دەبێت لە "یییاااووووو."



***"What's all that noise?"*** asks Antoine. ***"Look! The carpet's on fire!"*** says Henri. Spandini stands up. ***"Angelina! Quick, bring some water."***

**ئەنتۆین دەپرسێت: "ئەو هەموو دەنگەدەنگە چییە؟" هێنری دەڵێ: "سەیرکە! کومبارەکە ئاگر دەگرێت!" سپاندینی هەڵدەسێتە سەرپێ: "ئەنجێلینا، خێراکە هەندێك ئاو بهێنە."**

Marcel looks over the bookcase. He can see the Mona Lisa on the Spandini's desk. ***"OK,"*** he thinks. ***"This is it."*** After that he runs down the curtain, across Spandini's desk, picks up the Mona Lisa, and runs out of room.

**مارسڵ لەسەر کتێبخانەکەوە تەماشادەکات. دەتوانێت مۆنا لیزا لەسەر مێزەکەی سپاندینی ببینێت. بیردەکاتەوە "باشە، ئەمەتا." دوای ئەوە بە پەردەکەدا ڕادەکاتە خوارەوە، بەسەر مێزەکەی سپاندینیدا. مۆنا لیزا هەڵدەگرێت و لە ژوورەکە ڕادەکاتە دەرەوە.**



Marcel runs for a long time. He thinks, ***"I want to leave the Mona Lisa somewhere safe. But where?"*** Then after twenty minutes, he stops in a quiet street.

**مارسڵ بۆ ماوەیەکی زۆر ڕادەکات. بیردەکاتەوە"دەمەوێت مۆنا لیزا لە شوێنێکی بێ مەترسیدا بەجێ بهێڵم، بەڵام کوێ؟" پاشان، دوای بیست خولەك لە شەقامێکی چۆڵدا دەوەستێت.**

In front of him there is a police station. The front door has a letter-box. ***"Of course!"*** Marcel thinks. ***"That's it."*** He stands up tall. Then he pushes the Mona Lisa through the letter-box.

**لەبەردەمیدا بنکەیەکی پۆلیس هەیە. دەرگای پێشەوەی سندوقێکی نامەی پێوەیە، بیردەکاتەوە"بێگومان، ئەوەتا!" خۆی درێژ دەکات، پاشان پاڵ بە مۆنا لیزاوە دەنێت بۆناو سندوقی نامەکە.**



Two days later Marcel is in Paris again. At the station he sees a newspaper. it says, ***'ITALIAN POLICE FIND THE MONA LISA'.*** Then he goes to the Louvre and tells Celine everything.

دوو ڕۆژ دواتر مارسڵ جارێکی تر لە پاریسە. لە وێستگەکە ڕۆژنامەیەك دەبینێت، تیایدا دەڵێ:"پۆلیسە ئیتالییەکان مۆنا لیزا دەدۆزنەوە." پاشان دەچێت بۆ لۆڤەر و هەموو شتێك بۆ سێلین دەگێڕێتەوە.

***"Nine cats!"*** she says. ***"Oh Marcel, are you all right?"*** ***"Yes, I'm fine,"*** Marcel answers. He goes to the Celine's window. ***"And the Mona Lisa is fine, too. Look Celine. She's smiling."***

سێلین دەڵێ:"نۆ پشیلە! ئۆو مارسڵ، ئایا تۆ باشیت؟" مارسڵ وەڵام دەداتەوە:"بەڵێ، من باشم." دەچێتە لای پەنجەرەکەی سێلین و دەڵێ:"وە هەروەها مۆنا لیزاش باشە، سێلین سەیرکە ئەو زەردەخەنە دەکات."

پرۆژەی خۆراهێنان لەسەر زمانی ئینگلیزی زنجیرەیەك چیرۆکە بۆ بەهێزکردنی زمانی ئینگلیزی ، کە بە شەش ئاستی جیاواز دەردەچێت ، وە لە هەر ئاستێکدا ژمارەیەك ووشەی نوێ فێردەبیت

ئاستی یەکەم : دەسپێکەران
ئاستی دووەم : سەرەتایی
ئاستی سێیەم : پێش ناوەندی
ئاستی چوارەم : ناوەندی
ئاستی پێنجەم : دواناوەندی
ئاستی شەشەم : پێشکەوتوان

Level - 1 -